ئەوەی ئیسلامەو قورئانی ئەوێ ئەبێ شوێن ڕەولی عومەر بکەوێ
لە تێکۆشانا نابێ بسرەوێ چش با شەهید بێ یا دین سەرکەوێ
ڕاستە ئەو کەسە دینی خۆش ئەوێ
نانوێ بە وشەی گورگانە شەوێ

بەڵێ ئەو کەسەی سەربازی دینە دینی بەلاوە گەلێ شیرینە
ئەر بۆو لاشەیشی بەن لەمەکینە هێشتا لانادات لە ڕێی ئەم دینە
کە وایە سادەس ئەوەی ئەخەوێ
بەدەنگی پەستی گورگانە شەوێ

لە تێکۆشانا ئەوەی ئەسرەوێ یا بە ئاهەنگی دوژمن ئەخەوێ
لەپەڕ دڵسۆزێ با فریای کەوێ ئاشی بێگانە با بێئاو کەوێ
موژدەبێ ئەوجار دوژمن ئەخەوێ
بە تەکبیر بۆی کەن گورگانە شەوێ

یاران ئەم دینە ئیستە لە ئاوە گەوهەرە و دەوری ئاور و ئاوە
ئەر ئاوو تینی ئاور پێی بگەن ئەوسا مەربڵێی ئەترافی داوە
دەسا هەرکەسێ ئەیەوێ خەوێ
بەدەنگی پەستی گورگانە شەوێ

مەڵێن ئیسلامە چون خوا نایەوێ موسوڵمان لە ڕێی دیندا ناسرەوێ
مادام ئەو کەسە هەروا ئەسرەوێ قەزای گەورێکی خوێری لێ کەوێ
نژماری موژدەس هیچکەس ناخەوێ
نەماوە باوی گورگانە شەوێ

دەگاشێخان ٦٨/١١/١٩

# «به ناوی ذاتی پاکی کردگار»

به ناوی ذاتی پاکی کردگار    سلاْوات له سه‌ر ئه‌حمه‌دی موختار
هه‌م له‌سه‌ر ئالی نوجه‌بای ئه‌طهار    بۆسه‌ر سه‌حابه‌ی ڕێبه‌ری نازار
تاکو قیامه‌ت بێ به‌ین بێته خوار

هه‌م بۆسه‌ر ئه‌وه‌ی پێشه‌نگی دینه    تامه‌زرۆی به‌ری داری ئایینه
بۆ سه‌ر ئه‌و که‌سه‌ی ئه‌هلی یه‌قینه    ڕێبواره له‌بۆ پیری مه‌دینه
بڕژێ به دایم وه‌ک لێزمه‌ی به‌هار

برام گوێ بگرین پێکه‌وه به دڵ    ساتێ له دنیا باخۆکه‌ین غافڵ
چینه سه‌ر ڕه‌ویه‌ی پیاوانی عاقڵ    به‌شکم یه‌کدڵی بۆمان بێت حاصڵ
له سایه‌ی لوتفی ذاتی کردگار

یاران ئه‌م دینه‌ی ئیسته‌له ناوه    هه‌روا به سه‌هلی بینا نه‌نراوه
هه‌زاران سه‌ری له ڕێ دراوه    هه‌تا له‌م دونیا وا دامه‌زراوه
چه‌ن قاره‌مانی بۆ کێشرا له‌دار

حه‌زره‌ت ﷺ له پێناو ئه‌م دینه جوانه    به‌سه‌دان شێوه لێی درا تانه
پێیان گرت ئه‌نواع بڕ و به‌هانه    چه‌نها شکه‌نجه‌ی خزم وبێگانه
ته‌حه‌مولی کرد سه‌یدی سه‌ردار

له‌ولاْتی خۆی ده‌ربه‌ده‌ریان کرد    سپلۆت سیفه‌تان سپلۆتیان تێ کرد
له تائیفا بو به‌رد بارانیان کرد    دیانی پیرۆزیان له سه‌ر دین ورد کرد
بۆ جه‌لبی ڕه‌زای زاتی کردگار

ئه‌نواعی ڕه‌نجی قبوڵ کرد بۆدین    برسی و تینوه‌تی کردبوی بێ‌تین
یه‌که‌ر ژیانی ته‌رخان بو بۆدین    به عه‌مه‌ل ده‌رسی دا به سه‌حابین
بۆی بڕژێ سه‌لام له‌سه‌ر تا به‌خوار

بوبه باخه‌وان بۆ باخی ئیسلام    له به‌ر ڕه‌زای حه‌ق بێ‌بوجه و مه‌رام
بێشه‌ی ئیسلامی پڕ کرد له‌نه‌مام    له وێنه‌ی عومه‌ر عه‌لی و حه‌مزه‌ی مام
که بۆ دین له‌شیان کرا له‌ت و پار

بە کورتی دین بە هیجرەت و غەزا　　بە ماڵ جێهێشتن خوێن‌دان و سزا
وا نەشر کرا لە ئەم سەر ئەرزا　　تۆش وائەزانی بێ‌هیچ دامەرزا
خۆی بۆ خۆی بێ‌ئەرک بووە پایەدار

سەحابین‌کانێ بەیعەتیان ئەکرد　　بەڵگەی تێکۆشان خۆیان مۆر ئەکرد
پشتیان لەخەوو لەسستی ئەکرد　　ئەفرینیان لەژین ژێردەستی ئەکرد
وەک ئێمە نەبون سەرکەن بەرەوخوار

گیانیان بۆ حیفظی ئەم دینە ئەویست　　بەڵێ‌و ئەرێیان لە حەزرەت ئەبیست
ناحەزیان هەرگیز بە دڵ نەئەویست　　هیچ کەس ناحەقی لێیان نەئەبیست
بۆ هیچ دوژمنێک نەئەبون بەدار

قەد نەئەخڵەتان بە پارە بۆکەس　　نەئەبونە پیاو ئەرەس و ناکەس
مەبەستیان تەنیا ڕەزای خوابوو بەس　　بۆیەکا ڕەنجیان نەچو بە عەبەس
نەئەبون بە گورز بۆدەستی نەیار

خوا هەر حوکمێکی ئەناردە سەریان　　زو وەریان ئەگرت لە پێغەمبەریان
ئەیانکرد بە تاج بۆ تەوقی سەریان　　تا بێتە سێبەر ڕۆژی مەحشەریان
وا ئەژیان هەمو صەحابەی ئەخیار

برای پشتی‌یان دور بوایەت لە دین　　بە ڕۆح و بە دڵ لێیان ئەگرت قین
نەبو لە ناویان کردەی ناشیرین　　بە تایبەت بوغض وحەسادەت و کین
لەل هەمو کاری خراب و نابار

هەمویان یەکدڵ یەک بڕواو یەک بیر　　وەکو یەک ئەژیان ئەمیر وفەقیر
بۆ دەردی یەکتر گشت ئەبون زویر　　قەد یەکترینیان نەئەخستە گیر
بە وێنەی ئێمەی ئەزاندوی بەدکار

پشتی یەکتریان قەد بەر نەئەدا　　یەک لە یەکتریان هەرگیز نەئەدا
تەڵەیان لە ڕێی یەکتر نە ئەنا　　یەکتریان بۆ کەس لەدەس نەئەدا
لە یەکتر هەرگیز نەیانبو جەخار

ولاتی خۆیان جێ نەهێشت بۆ دین    لە لای دوژمنان نەکەوتنە بەرقین
دەس بەردار نەبون لە گیانی شیرین    بەش نەشئونما بکات داری دین

مێژو بەم جۆرە کردویە تۆمار

سەیرکە بەسەرهات خوبەیب و چەن یار    کاتێ کە دوژمن لێ ی دان پەلامار
چۆن لاشەی پاکیان کرا لەتو پار    بە چۆک نەهاتن لای چینی نەیار

ئیسلام بەوانە ئەکات ئیفتیخار

دوژمن لە فیکرەی خوبەیب ئەپرسێ    بزانێ چەنێ لە مەرگ ئەترسێ
ئەڵێ بە عینوان تەسلیم بون دەسێ    ئەر بەرز بکاتۆ لە مەرگ ئەخلەسێ

چون خڵەتاوە و فەقیرە و هەژار

یەکێ بە خوبەیب ئەم قسە ئەڵێ    موحەممەدﷺبۆ خۆی لە ماڵ نیشتە جێ
لای ماڵ ومناڵ خۆی دائەنیشێ    تۆ بۆچی ئەبێ گیانت دەربچێ

پێت خۆشە لەجێت ئەو بدرێ لەدار؟

خوبەیب لە مردن کە نیە باکی    ئەڵێ ئیلاهی ئاگایت و تاکی
لە لام ناخۆشە بژیەم بە چاکی    موحەممەد ﷺ درک بات لە پێی پاکی

کاش قەزای خوبەیب ئەکەوت لە هەزار

یاخۆ عەبدولای حوذافەی دڵ ڕون    کاتێ کە ئەیبات دوژمنی زەبون
بیخاتە قازانگ کوڵ هاتوی زەیتون    چون لە سەر دینە ئەڵێ جابەتون

والە گیانی خۆ ئەبون دەس بەردار

یا خۆ سومەیە سلاوی لەسەر    شاگردی مەکتەب ڕەسولی سەروەر ﷺ
سینگی پیرۆزی کە کرد بە سپەر    تیکە تیکە بو بە ڕمح و خەنجەر

لە ڕێگای دینا وای کێشا ئازار

بەڵێ حەزرەت هەمولەپێشا    لە ڕێگای دینا وا ڕەنجیان کێشا
ئەتلانۆ لە نێو مەینەت و ئێشا    لە لای ئەجنەبی و لای خزم و خوێشا

بۆ ئیجرای ئەمری خوا بەرزبو هاوار

درەختی دینیان ئاو ئەدا بە خوێن    بۆ ئەرەقی دین ئەچون شوێن بە شوێن
بێباک لە کوشتن لە لۆمەو لە جوێن    شاخ و دەرو دەشت بۆ دین ئەگەڕێن

نیانە ترسی ظاڵم و زۆردار

ئافرەتیان ڕوت و بەرەڵا نەبو    دینیان بۆ دنیا بەر بەڵا نەبو
شێریان لە پێستی چەقەڵا نەبو    لاویان لە تیرەی ئاژەڵا نەبو

بۆیە دەماریان بەرز بو وەک چنار

سابە بیرا بێ حەیفە نەزانین    بۆچ بە ئەحکامی خودا ڕەزا نین
تاکو کەی لادان لە بەرنامەی دین    تاکو کەی ئەبێ بە پەستی بژین

بەسیە کوێرەڕێ مەگرە لارەلار

دەورەیان داوین دەردو نەخۆشین    کەچی بۆ دەرمان کەمێ ناکۆشین
بۆ دەرمانێکی قاتیل ئەکۆشین    بە دەستی بێنین ئازا بینۆشین

بە جێی دەرمانی لابەری ئازار

لەو دەردانەی وا قاتڵن وەک سەم    لامان بونەتە زامی بێمەڵهەم
گوێگرە چەنێکیان بابۆت بەیان کەم    کە تۆ ئەبیی بەش سازکەی مەڵهەم

بۆ موعالیجەی گرۆهی زامار

لاسەروی هەمو موحەببەتی ماڵ    لە ڕێی دیندارا بو بە کۆسپو چاڵ
دینداری کردە مێوەی کرچ و کاڵ    بۆ دنیا بە دین کردمان ئاش بەتاڵ

بوینە عاشقی سامان و دینار

بۆ کەمێ پارە ئیدەمان کرد وێڵ    نەک هەر وێڵ کردن بۆ فەنای سەد فێڵ
سەد فتوای ناحەق دران بە بەرتێل    هەتاکو بوینە جێماوی دوای خێڵ

بووین بە بۆسۆی کۆڵان و بازاڕ

بۆ پولە یەکتر ئەخەینە نێو داو    بۆ کزی یەکتر ئەکەین چاوە چاو
بە لای لایەی پوڵ چوینە خەوی خاو    پیامان هەڵپژا هەزاران قوڕاو

بۆمان بو بە بۆم ئەتۆمی نابار

بۆ بەدەس هێنان سەروەت و سامان    پشتمان کروەسە قانونی قورئان

تەحریمی ڕیبا نەما لە ناومان    ئەلحەق پارە باش، بوویت بە داومان

گیرۆدەت کردین بە جۆرێ نابار

بویتەسە دەم‌بێن بەستت دەم زۆرکەس    زۆرکەست خستە نێو ڕیزی ناکەس

زۆرکەست کردە ژێردەسەی تەرەس    عالەمێک بۆ تۆ بونەتە حەرەس

وەکو قارونی پەست و نابەکار

خانوی چەن قات وماشین و دوکان    دینی لە دەسمان چاک هەڵپرۆکان

غافڵیان نابین یەک چاو تروکان    ناڵێن مەعشوقن بۆ چینی سوکان

بۆ دەس خستنیان ئەکەین سەروخوار

با بێسێ نەقشەی ئەسڵی بێگانە    کە تەڵەی سەر ڕێی چینی لاوانە

ئەو لاوەی هەڵگر ئاڵای قورئانە    ئومێد و پیاوی داهاتومانە

پێوەیە تیری ناحەز بە میلیار

تا دوێ بو بەرگی شەڕیە کردە بەر    ئەچو شان بە شان عوممەر و حەیدەر

سینگی بۆ ئیسلام ئەکردە سپەر    دوژمنی ئەکوشت لە مەیدانی شەڕ

پەیامی دینی ئەبرد شارە و شار

قانونی دینی موتالا ئەکرد    سینگی دوژمنی یەکالا ئەکرد

هیممەتی بەگژ بە تالانەکرد    سەعی لە زێگەی حەلالا ئەکرد

یەک بۆ یەکترین نەیان بو ئازار

بۆ ناموسی یەک خۆی نەئەکرد لوس    لە بۆ بێگانە نەئەبوە جاسوس

نەئەبوە داردەس کومونیزم و ڕوس    بۆ دین ئەگەڕا شام و ئەندەلوس

بۆ تەرەقی دین ئەیکێشا ئازار

قورئانی ئەخۆند کاتی بێکاری    هەوڵی بو لەکات خەوو بێداری

ئاڵای هەڵ ئەگرت بە بێقەراری    دور بو لە پەستی و لە گەنەکاری

بۆیە ئاڵای بەرز نەئەهاتە خوار

وەک ئیستە نەبو پەزارە و پەرۆش    گلاڵەی دوژمن خستویە نەخۆش
ئەڵێی بە ئارەق کراوە سەر خۆش    ئەکسەرەن لاپێل لارو تێ ئەکۆش

زوان ئەملاسێنن بۆ یەکتر وەک مار

ئەکسەر بە پارە هەڵخزێنراون    بە چەشتەی زینا چەشت کراون
لە بۆ موسکەرات وا ڕاهێنراون    ئەڵێی بۆ پەستی تەعلیم کراون

غافڵ لە مەرگ و لەقەهری قەههار

بەعزێ تەبیبیش کە لە حاڵ زانە    حازیقەو ڕەئیس بیمارستانە
سەرەڕای ئانەم هەمو دەردانە    گوێی لێ خنیوەو خەریک ژیانە

نایەت نەخۆشێ عیلاج کات و چار

بێدەنگ بون هەتا دەردی بێدەرمان    سیرایەتی‌کرد چووە ناو خۆیشیان
ئیستە ئەبینی زۆر لە تەبیبان    بە نەخۆشینی ئیمان موبتەلان

نمونەی زۆرن هەمو ڕون و دیار

فتوای ئابەجێ هەزار بە هەزار    لادان لە ڕچەی سەلەفی سەردار
بەدناو کردنی ئەئیممەی ناودار    عادی ژمێری ڕێبەری نازدار

کامیان موزیڕ نین وەک ئەژدیها و مار

لاتا ئەوترێ سەدان ناشیرین    بە خانەدانی ڕەسولی ئەمین ﷺ
یا بە صەحابان هەزاران تەوهین    ئالایەق وتن بە پیاوانی دین

تۆش هەر بێدەنگی وەکو بەردو دار

هەزاران نەقشەی دین فەوتان کێشرا    ئالای ئاحەزت لەلا چەقێنرا
سەدان نەوع بەلات بەسەرا هێنرا    کردەی دژ دینت لەسەر سەپێنرا

هێشتا هەر سکوت ئەکەی ئیختیار

دەوای بێدەنگی کاری تێکردی؟    یا هەر ئازارە بێدەنگی کردی؟
هاکا وەکو دەنگ ڕەنگیشی بردی    بە بێدەنگ و ڕەنگ کەس ناڵێ مەردی

دەسا ڕاپەڕە بەرزۆکە هاوار

نــــــژماری زۆره دەرد و نــــەخۆشی  بــە نــاحەق بێکەس ئەونە ئەکۆشی
تــاکــەی کــاڵای غـەم وەهـا ئەپۆشی  ئــــاخری دەوای دەردت ئـــەنۆشی

دوکتور هەمویان نابن دەردەدار

٧٥/٥/٢١

## «داخەکەم دیسان»

داخــــەکــەم دیســان بــەرزە هــاوارم  بـــە ســـۆزە دەنگــی گــریان و زارم
دادی بـــــێدادی ئـــەدات ئـــازارم  خــۆزگە بــە پــێشو بــووە بــە کــارم
لەدەس وەیشومەی قەباحە تبارم

غــــەرەز لە عــەرزم نــەقسی خــۆمانە  ئــــینتیقادێکی گــــەلێک دۆســــانە
لەگــەڵ تــۆی بــرام نــەک ئەو کەسانە  هـــابیرو هـــاودەس بــۆ نــاکــەسانە
بۆهەتکی یاسای پەروەردگارم

بـــاوکم بـــراکــەم ڕۆحــی شـیرینم  شوێن کە وتوی قورئان شـەریکە دیـنم
ئـەی بـە نـاو ڕۆڵـەی سـەلاحەددینم  سـاتێ گـوێ بگـرە لە وتـەو شـینم
بەش هەر جۆرە بێ بکەی تیمارم

دەردی مــن تــەنیا دەردی خــۆم نــیە  بۆ سەر ئێشەی خـۆم شـین و ڕۆم نـیە
دەردی تــۆس هــینی شـام و ڕوم نـیە  عــیلاجی ئــەکـرێ خــۆ ئــەتۆم نـیە
بڵێی ئەتەقێ و ئەدات ئازارم

ئــــەڵێم مــن و تــۆ کــە مــوسوڵمانین  مــوجری قــانونی بــەرزی قــورئانین
شوێن کەوتوی حەزرەت پێغەمبەرمانین  جــبریل قــورئانی وەهــا بــۆ هــانین؟
لەخزمەت ذاتی پەروەردگارم؟

خوا کە قورئانی نـارد بـۆ پـێغەمبەر ﷺ  چۆن تەبلیغی کرد ئەویش بە بـەشەر؟
یا هەر خۆی چۆن بو عەمەڵی یەکـەر؟  لەگـەڵ هـەزاران شـێری وەک عـومەر؟
نەبون بە سەرۆک قافڵە سالارم؟

ئەوانیش وەکو ئێمەی خاوەن بیر    دینیانکۆت ئەکرد وەک بەندی و ئەسیر؟
هەتا سەروەت و سامان خەنەگیر؟    یا هەڵیان ئەبژارد کوشتن و زنجیر

بۆ ئیجرای ئەمری ذاتی جەببارم

کاتێ مەترسی بوایەت لە کارا    زوانیان خول ئەدابە هەزار بارا؟
یا چۆڵ گەڕاندن بە بەردەم مارا؟    یا کەللە سەریان ئەکرا بە دارا؟

هەر وەکو خوبەیب یاری سەر دارم؟

یا هەر حەزرەتی گەورەی ئینس و جان    چەنیان ئەجاسەت بە سەرا ڕژان
دیانی پیرۆزیان لەسەر دین شکان    کەچی هەر کۆڵی ئەداو بێ وچان

جیهادی ئەکرد پیری نازدارم

سەدان دلێر و بگرە هەزاران    بۆ ئەوەی دەزگای دین خەنە گەڕان
سەریان بە شمشێر لە لاشە پەڕان    ئەمما لە دینی خۆ وەرنەگەڕان

لە سەحابین و باقی سەردارم

ڕەنجیان ئەکێشا لە پێناوی دین    تەرجیحیان ئەدا بە سەر دینا ژین
لای خۆی بە عەمەڵ دەرسیان فێر کردین    تا بە گیان ومال ئیسلام پارێزین

هەزاران مەردی بەروز و ناودارم

ئەولادی خۆیان بۆ دین دا بەکوشت    خوێنی خۆیانیان بۆ بەرزی دین ڕشت
بۆ حەساری دین خۆیان کردە خشت    لە یاسای خوایی هەڵیان نەکرد پشت

ئەگەڕان شاخ ودێهات و شارم

زەجرو شکەنجەی لە ڕادە بەدەر    توش بونی هەزار هەزار دەردی سەر
لەدەس دانی ماڵ لەگەڵ گیان و سەر    بۆ ئەوەی داری ئاوات بێتە بەر

ئەڕەنجێ لێیان پەروەردگارم

بە ئەسپو وشتر یا هێسرێ لات    ئەچون بۆ جیهاد وڵاتە و وڵات
ئەگەڕان شاخ و بەندەن و دێهات    بە شەهید بونیان ئەگەینە ئاوات

چەنهاوەک حەمزەی میری ناودارم

ئەحکامی دینیان قەد نەئەکرد ون    نەئەبونە دار بۆ دەستی دوژمن
یاخۆ بەجەردە تا ئەحکام بدزن    یا ڕێگە لوس کەر تا یاران خزن
بە نەقشەی ڕەشی عەدوی نەیارم

ئەولادی خۆیان چاک ڕائەهێنا    لە دڵیا تۆمی دینیان ئەچێنا
نەک لە ناو بەرگی یاسامرێنا    یا لەناو بیرێ زۆر دڵ تەزێنا
بیکەن بە گورگ و بدات ئازارم

بە پێی قورئان بویاسای ژیانیان    هەر بە قورئانبو وەزعی ژنانیان
ژەکی گۆچ کردن خاو و خێزانیان    بۆیە هەردەمێ ماڵ و ویژدانیان
پارێزراو ئەبو لەدەس نەیارم

مەبەستیان تەنیا جیپەی خۆ نەبو    تەماعیان وەکو من و تۆ نەبو
کەس بۆ کەس گورگی سەر ئاسۆ نەبو    کەس بۆ ماڵی کەس بەداخۆ نەبو
هیچ کەس نەیدەگوت گەورە و سەردارم

داو دانەئەنرا لە ڕێگەی هیچ کەس    کەس دانەئەنیشت دەس لە بانی دەس
ڕێگە نەئەدرا قەتعەن بە ناکەس    هەتا واریدبێ وەک سەرخۆش و مەس
تا دۆس نەمێنێ گات بە هاوارم

ڕێیان نەئەدا تاکو بۆژە بیر    بیری گەلالەی ئیستیعماری پیر
لە ناو بیراندا خۆی‌کات بە ئەمیر    بیری خوا دۆزی بکاتە ئەسیر
وەکو ئەیبینن لەدێ و لەشارم

لە بەر مۆدی ڕۆژ دین ویێل نەئەکرا    بۆ نەفعی شەخسی قەد فێل نەئەکرا
تەئیدی قسەی لاپێل نەئەکرا    ڕێگەی جەماعەت لاهێل نەئەدرا
بێن و بە ناحەق بدەن ئازارم

وەک ئێستە نەبو نیفاق لە ناوا    پێی خاسو خراپ کا بە نێو داوا
بزان بێدەنگ کات لە خەوی خاوا    نەزان نوقم کات لە نێو زەلکاوا
بە ناحەق نیە خەریکی زارم

دیاره بە ڕاستی تا ئێمە وابین بۆ خوا نەبین و هەر بۆ ژیا بین
ئالودە کەری یاسای خودا بین بە خواستی دوژمن لەیەک جیا بین
ئەبێ شین و ڕۆ بێ بەکارم
ساکە وەهایە بیرۆکەین سەرجەم پێکۆ هەڵبگرین وەک پێشو پەرچەم
ساز کەین بۆ زەخمی دەرونمان مەڵهەم بەڵکە نەجاتمان بێت لە دەرد و غەم
لە سایەی لوتفی پەروەردگارم
با بەس قانونی خودای بانی سەر بگۆڕینەوە بە قسەی بەشەر
ئەویش قسەیەک وەک تیر و خەنجەر ناموسی گشتی ئەخاتە خەتەر
لەگەڵ ویژدان و دینی بەکارم
مۆدی ئوروپا مەکە بە ئەساس لە بۆ بێگانە مەبەرە دەم ڕاس
تەقلیدیان مەکە وەکو گەوج و کاس مەبەرە میکروب بەسیە خوا نەناس
بۆ بوی بەکرم و دو پشک و مارم
بۆ بویتە ئافەت درەختی دینم دات بە سوتاندن باخ و پەرژینم
تەواو گۆڕیت لێم ڕەوشتی ژینم دیارە تا تۆم بێت مات و حەزینم
وکو ئەمساڵ و پارو پێرارم
ئیتر بە هیوای هەڵهاتنی خۆر نەمانی زاڵم لەگەڵ جەور و زۆر
تیماری زامی کولاوە و ئاسۆر تیاچونی مۆدی تازەهاتوی بۆر
ئەمایەر لوتفی پەروەردگارم
۷۳/۸/۴ نژماری

## «دوربالاوەکان»

دوربالاوەکان ئەڵێی دزراون لە هیچ بارێکۆ وەک خۆ نەماون
وەها لێو بە بار کزو داماون ئەڵێی لە دوا چۆڕ لافاو جێ ماون
هیچ کەس نازانێ کەگەنج ولاون
هەمو ئەسیرو پێبەندی تانەن نەچیری داوی حیلەی بێگانەن
غەمباری ئاسۆی چیای زەمانەن گەرچی داش دیار بۆدین ئەمانەن
بەلام کز ئەڵێی گوڵی ژاکاون

گوایە هی‌چی بێ ئەم لاوانەی من    ئەم تین و تەوژم ئەم چاوانەی من

لەبـاری دیـنۆ ئـەوەندە کـزن    کـەوتونەتە بـەر ڕەهێڵەی دوژمـن

بخۆری تەشەر ئێش‌و زوخاون

خۆهەر ئەمان بون زەمانی حەزرەت    کالأی ئیسلامیان گەیان بە قیمەت

ئەمان بەم دینە بەخشی‌یان زینەت    قبولّی ڕەنج و ئازار و مەینەت

کەچی ئیساتێ وا دۆش داماون

وەرن باساز کـەین بـیمارستانێ    دوکـتورێ دڵسـۆز لەدەرد بـزانێ

خـەینە بـەردەستی دەواو دەرمـانێ    بـەڵکو بـنچینەی دڵـپاکی دانێ

ئەم وەسێتانە زۆر جار بیسراون

بـەڵێ بـە ڕاستی هـەمو نـەخۆشین    بـێ دڵسـۆزی‌یە ئـەونە پـەرۆشین

پیرو لاوو جوان باگشت تێکۆشین    لەزامـی کـۆنە بـا چـاو بـپۆشین

ئەها بێگانە کەڵبە ئەساون

ئـەم لاوانـەمان بـۆیە نـەخۆشن    وەیـلانی نـاوچەو مـات و پـەرۆشن

لە ڕێگـای دیـنا کـەم تێ ئـەکۆشن    بـەنەفعی دوژمـن ئـەونە ئـەجۆشن

دیارە بە چاکی حالّی نەکراون

بەڵێ ئـەم لاوەس قـەدیم ئـەسکەر بـو    سوار چاکی سەرباز بۆ پێغەمبەر بـو

لاو بو هاوڕەزمی حەزرەت عومەر بـو    خـاوەن کـردەوەو هـەوڵ و زەفـەر بـو

مێژوی کردەوە گشت لە بەر چاون

سـا دوکـتوری دیـن کـە مامۆستایە    قـورئانی شیفای لە بـەر دەسـتایە

چـاکـترین مێعمار ناوچی وەستایە    ئـاخ پـەیمانێکی وەهـای بـەستایە

بچرایەت هەرچی تەڵەکەو داون

عـەقەبەی تـازە بکـردایـەتۆ    درەخـتی عـەهدی ئـاو بـدایـەتۆ

ئـایە و حـەدیسی بـۆ کـردایـەتۆ    چـی ڕۆڵـەی دیـنە کـۆی کـردایـەتۆ

مە خسوس ئەوانەی گورزی قوڕاون

ئاخ ئەبوبەکری یا عومەر ناوێ دڵسۆزێ بۆدین هەڵبژرکاوێ
خەباتکارێکی ئۆقرە نەماوێ خۆی هەڵ ئەماڵی بە دڵ و چاوێ
ئەکەوتە فکری هەرچی جێماون

ئەهات بە فکری (لاتنازعوا) ئەیبردە دڵ خەڵک (لاتفرّقوا)
بە داری ئیمان بیدایەت نمو بە خەو نەمدیایەت ئەم دەورە کەبو
کێ موژدە دێنێ ئەڵێ گونجاون

ئازیزەکانم سا بەدەستو برد دوژمن تەکبیری خۆیی تەواو کرد
هەندێ دەستوریش بە ڕاس ئیجرای کرد براکەی تۆی دزی ئەو بە برای کرد
سەد ئەسەف تاکەی ئەوەندە خاون

زێڕی پڕ عەیار ئیسلامی دزی بە چپەی بن باڵ بە هەوڵی فرزی
کەمتەرخەم مەبە پێت ئەڵێن گورزی دەورت ئەژدیهاس بڕوا بۆ چزی
هەدیەیان ناڵە و ئێش و زوخاون

حەتمەن بە بێشک وایە لەلای من هەیە داردەستە بۆ دەستی دوژمن
زۆر تێنەکۆشێ کە مەبەستی من بەتاڵ ناسێنێ لای دۆست ودوژمن
بە لام سەد شوکر تۆمی بێناون

ئەڵێ کامەیە کوا دین فەوتاوە خۆ قورئانەکەی خوا هەرواماوە
ئیتر ئەوەندە گێژو داماوە نازانێ ئەوەی نوێ فەوتاوە
ئەڵێ کەی عەدون دەم بە سلاون

بە لام لەو لاوە نەقشەی دین فەوتان قورئان و مزگەوت پێکەوە سوتان
لە جێی موحەممەد ﷺ بونی نەمروتان ئێسقان و مێشکی ئیسلام کروتان
ئاغەیش هەر ئەڵێ دەم بە سلاون

قیبلەی دوێنەمان فەلەستینی گوڵ ئەسیرە بەدەس دەسەیەک گادڵ
بێ ئەوەی لەمن یا لە تۆ کەن سڵ میللەتەکەیشیان کردووە پڵ پڵ
ئیستە هەڵلوشی جۆگەی زوخاون

یا قیبلەی حازر کابەی پیرۆزمان    مایەی شانازی عەشیرە و هۆزمان
جێی لە دایکبون تاقە دڵسۆزمان    گۆڕەری حاڵی پەست و ناڵۆزمان
لەوێدا کوفو خۆیان حەساون

یاران هەمومان بێغەمین لە دین    وابین نەک بێغەم هەمو مردووین
چونکەشوێنکەوتویڕەسولیﷺ ئەمین    ئەبێ پارێز کات لەمتی و نووین
یەقین ئەوانەی وەهان خراون

ئەنا مەککەیەک مەرکەزی دین بێ    کێ پێی ڕازییە دیلی بێ دین بێ
جێیسەربازیڕوسئەمریکا و چین بێ    قەحبەیش لە دەوری بە پێکەنین بێ
لای خۆیۆ دافێع چینی داماون

گوێ بگرە مەڵێ پەست وبێ شەرمە    جەرگم سوتاوە وا دڵم گەرمە
ئەو مەککە کەوا زادگای ڕێبەرمە    ئەمڕۆ ئەسیری قاتڵی سەرمە
ئەڵێن لەو شوێنە خۆیان حەساون

ئەودەم لە مەککەی مەحبوبی هەموان    حەزرەتی ڕەسول ﷺ پێی نایە جیهان
بەڵام سەد ئەسەف بە کوێری گشتمان    سۆزی ڕۆژ زوڵی ماتریالیستان
ئەڵێن لەو ئەرزە پاکە ڕواون

لە باتی حاجی لە دەوری کابە    لای قەبری حەزرەت گەورە و سەحابە
هەی بگرەی زیناو نۆشی شەرابە    دەسا ئەو دڵەی بۆ دین کەبابە
هەستێنێ هەرچی خەوتوو جێماون

ڕایان پەڕێنێ چی موسوڵمانە    ئەنا ئەم بونە لە جێی نەمانە
کەی ئەمە یاسای ئەهلی ویژدانە    بەسیە ناپەسەن مەگرە بەهانە
تاکو کەی ئاوا لە خەوی خاون

سابەسیە خەوتن توخوا هەڵمەتێ    تێکڕا پێکەوە بکەین هیمەتێ
بگرین لە ئیسلام بەش بەرەکەتێ    ئیسلام بێ بە خێو هەمو میللەتێ
بدەن جونبوشێ بەوانەی لاون

ساکێ یە بۆدین ئەهلی فریادە    ڕێگەی سەرکەوتن هەر ئیتتیحادە
ئەو کاتە ئیسلام لەبەن ئازادە    کە گەل مەشغوڵی هەوڵ و جیهادە
ئەنا وانەبێ هەروا جێماون

دەسا لاوەکان ویژدان مەمرێنن    بەڵگەی ڕورەشی خۆتان مەنوێنن
ئێوەن لەمەیدان دوژمن بەزێنن    موژدەی ڕزگاری گەلان ئەهێنن
چون لە هێزەکەی حەزرەت ﷺ جێماون

شەرمە بۆئێمە ئالای دین نەگرین    تا لە ڕێبازی ئیسلامدا ئەمرین
لە بەرانبەری دوژمن خۆ نەگرین    بۆلای خوانەچین ئەر بۆ ئەو بمرین
هیوای نژماریش هەردەسەی لاون

٦٩/٧/٢١

## «چەن ئافەت هەس»

چەن‌ئافەت‌هەس ئەوا ئەڵێم بەش بە دوربێ لە دینەکەم
نەباوەک تێغی زەهراوی ببڕێ جگەرو سینەکەم
هۆشی خۆت بێ لەگەڵ تۆمە ئەی هۆگرانی دینەکەم
پەیکی ئەشعارم بۆتۆیە کەوائیساتێ زینەکەم
بێ‌پێکەوە بڵێین نەمان یا سەرکەوتنی دینەکەم

بێ پزشکی لەناو دینا نەتیجەی ئافەتی دینە
خەستەخانە بەبێ دوکتور گەلێ زامێکی سەنگینە
پزشک و دوکتوری ئیسلام عالمی حەق ڕەوی دینە
دەسا کێ‌یە بۆ زامی دین دڵی پڕئێش و سەنگینە
موراجیعەی دوکتور بکات بۆ چاری نەخۆشینەکەم

دەرمانی خوا (واعتصموا)س لەناو ئیمەدا زەلیلە
تەفرەقەمان گورزی دەستە کە پیلانی عەزازیلە
دوری براو ئەولادو باب تەڵە و تەزویرە هەمحیلە
بە تەڵەو فێڵ سەید کران هەرچی شێر و بەبر و فیلە
گەر سەیری لە داوکەوتو کەی ئەڵێی کوا نرخ و تینەکەم

بەنەقشەو داوی ئیستیعمار دزینی زۆڵەو ئەولاد
براکوشتن و جاسوسی لەباتی مێهرو ئیتتیحاد
ئیستیبدالی عەدڵی عومەر کێیە کردویە بە ئەفساد
ئەوەی یاساغی ئیسلام بوئیستە ئەکرێ هەموی ئازاد
کامە دوکتور بکاچاری مەرەزو ئەخۆشینەکەم

ئەوەی تابیعی ئیسلامە بکافکرێ بە حاڵی خۆی
بکابەرگری سورێجە و هەمودەردی عەیاڵی خۆی
کە گەر دوچاری ئاوڵە بو لەدەس ئەدا جەماڵی خۆی
(قبل الوقوع) عیلاج ئەکرێ لەدەس ئەدا مەجالی خۆی
دوایی ئەڵێ دوکتور ئەبو پێم نیشاندا برینەکەم

سەری داوە ئێشو ئازار لەچی ئەعیاڵ و چی‌هۆزە
گێجەڵوکەی ئینتیقالی گەیشت ئەها تەپ و تۆزە
مەڵێ سبەی ئەمڕۆ بچۆ بۆلای ئەوەی کە دڵسۆزە
ئەبا ڕۆڵەکەت پێ‌ی گەیێ ئەم سەرەتان وئەم قۆزە
مەخۆ شەربەتی تاڵ و ترش بڵێ کوانێ شیرینەکەم

واریسانی پێغەمبەرن ئەمڕۆ دوکتوری دینی تۆس
ئەهەرڕۆژبەڵکەشەوانیش‌بە جێ ناهێڵن ئیشکو پۆس
دەسادەستت‌لەدەستی نێ بە ڕاستی ئەوە دۆستی تۆس
دەخیل‌ئەخلەتی بۆ ڕێوی برۆی گورگ بکەی بە دۆس
بڵێ دوکتور نیشانم‌دە عیلاجی ئەخۆشینەکەم

بەڵێ ئێشە نەخۆشینە نەخۆشینێکی پڕ سامە
لەسیل بەدتر سەرەتانە نەک هەڵامەتو زوکامە
ئیستە مەستی کە نازانی سبەینێ ئەڵێی سەودامە
یا تیری تانەی بێگانەس کە گرتویەسە ئەم لامە
ئەوجا مەگەر بۆ کزی دین بڵێی لێم گەڕێ شینەکەم

ئەی ئەمامانی پێغەمبەر ئێوەش کەبازی شکارن
کەلابەری کوفرو ئیلحاد سەیادی ئاهوی تەتارن
قەومەکەتان هەمو زەلیل نەچیری ڕێوی نزارن
شەرمە بڵێین بۆ هەڵمەتی مەهدی‌یە وا ئینتیزارن
دەسا تێکرا پەلامارێ بۆ سەیدی عەدوی دینەکەم

عەهدی (الست)ت لە بیرە کاتێ (بلی)ت ئەوت بە خوا
تۆ سەربازەکەی حەزرەتی غیرەتی عەسری ئەوت کوا
ئەوکاتە پڵنگ و شێرتە کوشت کەچی ئیستە چەقەڵ ئەتخوا
سەیری خۆتکە ئیمپریالیزم بۆ کزیت هاتوەتە سەما
سابیرێ لەخۆت کەرەوەو لە نەسڵی نوێی دینەکەم

ئیمانی ئێمەس زەبونە دینی ئیسلام هەرپتەوە
ڕۆژی ڕوناک لەدەس مەدە دوژمن تەمایەری شەوە
بە ڕۆژو شەو تێبکۆشە شەو بۆ دوژمن کاتی خەوە
دەستی خەوتوانیش بگرە بڵێ ساغافڵ هەستەوە
هەتا وەک ئەندەلوسی دوێ نەڵێی گوم بو نگینەکەم

دەسا بەوردی تێکۆشن ئەی هاوەڵانی ڕۆشنبیر
دەردو دەرمانی ئەو دەردە بخەنە بەر باس و تەکبیر
ئێوە شێری باغی دینن حەیفە ببنە بەندی و ئەسیر
ڕێی پێغەمبەر و هاوەڵان بکەن بەشارێگە و مەسیر
تا بە جیهان ئەناسێنن عەدڵ و بەرهەمی دینەکەم

کاتی خەوتنی تۆ نیە سبەی چی جوابی خوائەدەی
به خەوتنت قانونەکەی خوا و پێغەمبەر بەرپا ئەکەی
شەرمە لەلات کوفرکرێ وتۆش بە شادی سەفا ئەکەی
بەو سەفایەت قانونەکەی ئیلاهیە ڕیسوا ئەکەی
خەجاڵەت پێ مەخەرە سەر ئالاَسورو نەخشینەکەم

ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەر بکەرە مەرهەمی زامت
بە تێکۆشانی وەکوئەو سەری‌خە ڕاز و پەیامت
بەلاّم تۆ گەر وەک عومەری کوا ئەبوبەکری ئیمامت
بێ‌ئیمامی لێی گۆڕیوی هەدەف و ڕاستە شەقامت
بە دەستی دوژمن ئەم نەقشە کێشراو خرا نێو دینەکەم

ناوی خۆتت لێ نەگۆڕێ نەگەرتێ تۆ موسوڵمانی
فریوت نەدا دوژمنت بە قسەی لوسی گیرفانی
نەبیسراوە لە مێژودا بڵێن ئاور گوڵی هانی
هەوێنی خۆت بە ئەجنەبی بۆچی ئەدەی بۆ شیرنانی؟
ئەسەف کە تۆ ڕۆشن بیری و ئاوا ئەکەی لە دینەکەم

بۆ ئەخڵەتی بە قسەی چەور؟ ئەکەویتە شوێن ئەم و ئەو
پرولیتارت پێ ئەڵێن یاکومونیزم ومارکی ئەو
ئەڵێن ئەمانە چاکترن تا ئیسلام و ڕێبازی ئەو
خۆ پرولتارە کە ڕۆژی لە ئەفغانا کروە بە شەو
ئەی خڵەتاو بڵێ تەڵەب بۆ یاسین و تەڵقین‌ئەکەم

ڕوی خیتابم لە تۆیە ئەی شوێن کەوتوی عەدڵی عومەری
براکانت گیری داون بۆچ تۆ لیان بێ‌خەبەری
براکەی تۆ لە فەلەستین ئەزانی چی‌هات بە سەری؟
گەر بێ‌خەبەریت لە ئەفغان موسوڵمان نیت ئەی سەرسەری
لێ مەدەلافی ئیسلامی و مەبە بە دڕکی دینەکەم

دوژمنی دین و خوورزەوشت مانع نیە هەر جۆرە هەس
سەری تۆنابێ قبوڵ کا کڵاوی چنراوی ناکەس
ئەگەر ئەمڕۆ لێت دەرکەوێ ئەفکار یا ئەعمالێکی پەس
ئەیکەن بە تاوانی ئیسلام ئەڵێن سەیرکە فلانە کەس
بەحەق دیارە عەمەڵی زشت چون بێ لەکەس ئاینەکەم

دەسابا بەس بێ وەنەوزو خەوتن بە لایەی بێگانە
ئەگەر نۆبەیشە هەر نۆبەی ئاشی فەرمانی یەزدانە
بەسە ژینی خوفاشی سا ببینە ئەو نورە جوانە
ببە بە هیوای هەژار و سەربازی ئەم دینە جوانە
ئەڵێ نژماری وامنیش قوربانیم لە بۆ دینەکەم

٦٩/٦/٢٩

## «تاڵتر بو لە تاڵ»

تاڵتر بو لەتاڵ تاڵتر بو لەتاڵ تامێ من چەشتم تاڵتر بو لە تاڵ
وێنەی تاڵی تای خەیاتەی خاوی ماژولیای دەس بای ڕوی کوڵم و چاوی
وێنەی تای پەرۆش دەس زەدەی توڵفان توڵفی ناناگاه بە ئەرجی زوڵفان
دایم خول ئەخۆم بە دەس بای خەمان هاوارو زۆمە بۆ ساحێب کەمان
بەڵکە خەدەنگێ لە تیری موژگان بکات ئاراستەی ڕوی دڵ وجەرگان
بەش بەدەس بیگرم بیخەمە سەر چاو بە سێلاوی چاو بیخەمە سەر ئاو
ئەو کاتە پێکەم ئەمن پینەی دڵ تا دڵ بە لەتی ئەچێتە تۆی گڵ
سا کێ یە مەحرەم لای بالای خاوی بگاتە فریام مردم لە تاوی
بەش بیبەنە لای ناڵەی ئەم دڵەم ناڵەی ئەم دڵەی پڕسۆز و کوڵەم
ئاگاداری کەن لە حاڵی خەستەم بەشکم بەزەیی بێتۆ بە جەستەم
هەر جارێکیش بێ بەش بیبات نامم سازێژ کات برین دڵەی پڕزامم
بەڵکە ئیترکەم قایم کات قامەت ئەبا داخی دڵ بەم بۆ قیامەت
دەسا بێرەلام قبیلەکەی گیانی تا گیانم بۆ تۆ کەم بە قوربانی
یا تۆ خۆت فەرمو بە تێغی ئەبرۆت بیکە بە قوربان ئەم لاشە بۆ خۆت

بـــەشکێکم بـدەی نـــەجاتم لە غـــەم    تێغی دەستی خۆت بۆم کەی بە مەلھەم

کـــاتی مـــەرگیشم بـــا هـــەر بـتبینم    ئـــەو کـــاتە دەرچـــێ گـــیانی شـــیرینم

نـــژماری تـــــاسەی بـــالآی تـــۆیەتی    دوری تـــــۆ زامـــــی بـــێ پـــەترۆیەتی

٧٨/٢/٢٨

## «سرود»

بەڵێن ئەدەم شافیعی شەرتە لانادەم لە ڕێ    باناحەزتیکەتیکە گۆشت و ئێسقانم بڕێ

ئەونیجتیهادەی کردت قبوڵمە بەدڵ و گیان    حازرم لە پێناوی ئامانجت بم بـەقوربان

هەتاکو دڵ لێبدا و تاکو خوێنم تـیاماوە    ئەگەر زانیو مەمێشکم ئەنجن ئەنجن کراوە

شەرتە پەیمان نەشکێنم هەر ڕێگەکەی تۆ بگرم    چش بابەحیلەی دوژمن منیش لە سەر تۆ بمرم

ڕچـەورێبازت جوانـە گـرتت ڕێگەی پێغەمبەر    بوێتە پێڕەوێ ڕاساڵ هەزار سلاوت لە سەر

دەسا دوژمن بزانـە مـوسوڵمانم مـوسوڵمان    لەڕێگەی خۆم لام نادات تۆپ وتەیارەی جیهان

قورئانە چەکی دەستم ڕەزای خوایە مەبەستم    لە هەوڵ و تـێکۆشانام هـەتا مـاوم نـاوەستم

لام هیچ نیە ئەم ژینە خـوێنم هـەوێنی دینە    لە مێژە سـابتە بـۆم کـە دوژمـن دڵ بـە قـینە

دوژمـن بـەهیچ نـازانـم خـودایـە پشـتیوانـم    هــەرگیز کـەهاڵۆ نـابم لە هـەوڵو تـێکۆشانم

شـــەرتوبەڵێنی داومـــە شەرتە من بیبەمەسەر    بیکەم بەسایەی سەرم بەچەتری ڕۆژی مەحشـەر

موسوڵمان بێن بەخۆداوا بەسەرچو ڕۆژی ڕون    هاکا ناحەز لەهەرلا کردیە سەرت شەبیخون

٧٤/٥/١٣

## «سرود»

ئێمە سـەربازی دیـنین گـیانمان فـیدای قـورئانە

بـۆ تـۆ بـە چـۆکـا نـایین دوژمـنی دیـن بـزانـە

ئەگەرچی زۆرت داوە هـەوڵی فـەوتاندنی دیـن

ڕێبازمان ڕێیەکـە جـوان قـەد لەسـەریا لانـاچین

با خوێنیشمان بـڕێژن وەکـو حـەمزەی قـارەمان

ئەینین بە سەر سەرەوە ئەحکامی بەرزی قورئان

خوێنمان ئاوی حەیاتە کاتێ ڕژایە سەر خاک
لەو ئاوە پەیدا دەبێ سەدان دەستە گوڵی پاک
دۆس و دوژمن بزانێ تاوەکو دونیا دونیاس
گەورەترین بەرنامە قانونی ئەمری خوداس
بە عالەم دەسەلمێنین ئیسلام دینی خودایە
قەد فەوتاندنی نابێ هەتاهەتا هەتایە
حازرم گیانی شیرین ببەخشم بەئەم دینە
لە ڕێبازی لانادەم بیشم دەن لە مەکینە
هەرگیز لە بیری ناکەم خوێنی ڕێبەرانی دین
شەرتە قەتعەن نامەوێ ژیانێ دوربێ لە دین
ئاڵای ئیسلام خوێنینە گەر بکەی سەیری پێشو
پڕیەتی لە حەماسە باسی مەردانی مێژو
وەرن پێکەوە یەکسەر عەهد و پەیمان ببەستین
بۆ بەرزی دینی ئیسلام تێبکۆشین نەوەستین
وەکو یارانی حەزرەت شان بە شانی‌یەکترین
ئاڵای پیرۆزی ئیسلام هەر شەکاوە ڕابگرین

٧٤/٥/١٢

## «سرودی دیسان هاتەوە مەولود»

دیسان هاتەوە مەولود لە دایک بونی مەحمود
جەژنی گەورەی ئیسلامە خۆری ڕزگاری بزوت
هیوا و ئامانجی ئیسلام یەقینە وا دێتە دی
گوم نابێ خوێنی عومەر لە گەڵ عوسمان و عەلی
هەتاکو مانمان مانە سەربازی ڕێی ئەوانین
سەربازێ فیداکارو پارێزەری قورئانین

چـەكـی ئـايەت و حـەديس ولأتـمان ئـەپارێزێ
فەتعەن سەر نەوی ناكـەين بۆ هـيچ دوژمـن و هـێزێ
هەر وەكو ئەبوبەكر پەيمان ئـەدەين بـە حـەزرەت ﷺ
لە ڕێـی ديـنا نـاسرەوين ئـەر جـيهادە يـا هـيجرەت
وێـنەی عـومەری فـارۆق عـەدالـەت دامـەزرێنين
تـــەبليغاتی دوژمـــنان هـــەمو بــە چـۆكـا بـێنين
گيانی خـۆمان فـيداكـەين وەک عـوسمانی بـەتەمكين
بـينە شـەهيدی مـيحراب بـە خـوێن بپارێزين ديـن
وەک عەلی هەڵمەت ئەبەين بە (قاتلوا)ی ئەمری حەق
قـەلأت وفكـری دوژمـن شـەرتە هـەموی بكـەين لەق
ئـالأی پـەستی بـێگانە شـەرتە گـەوزێنين لە خـاک
بــــەرزۆ بكـــەينۆ ئـالأی حـــەزرەتی شـاهی لەولاک
بـــە دونـــيا بســـەلمێنين كـــە تـا جـيهان جـيهانە
قـــانون لە ڕوی زەويـــدا ئـــيتر تـــەنيا قـــورئانە
لە يـومنی تـێكۆشانمان فـەتح ئـەكـەين گشت ولأت
نـــايبی بــيلال كــێ يە بــانگی ڕزگــاری بــدات
و صـــــلّی الله عـــلی ئـــەو ســـالاری مـــەدينە
شـــــافع يـــــوم الجـــزاء لكـــلّ المـــذنبينَ
٧٠/٦/٩

## «سرود»

شـافيعی بـەڵێن ئـەدەم شـەرتە بـە دڵ و بـە گـيان
ڕێبواری ڕێگـەكـەت بـم كـۆڵ نـەدەم لە تـێكۆشان
شـافيعی دايكـو و بـابم كـردوميان بـە سـەربازت
جـــا كــە وەهــايە شــەرتە لانــەدەم لە ڕێـبازت

تـاکـو خـوێنم تـیا ماوە ڕێگـەکـەت شـەقامم بێ
لەم ڕێگـەیە ئـەمرم یـا ئـەبڕم ڕێی پـڕ هـەورازت
بێباک وترس لە دوژمن ئـەڵێم کـە سـەربازی تـۆم
مادەم تـۆم پێشەوا بیت دیـارە کـەوا سـەربە خـۆم
شافیعی گەرچی بڕینی ئەم ڕێگەی تـۆ زۆر سـەختە
چـونکە کـارو پیشەکـەت ئـەکـەوێتەسەر ئـەستۆم
بـەڵام ئـەوا بـڕیارە دوا بـەڵێن ئـەدەم بـە گـەل
نـاخەوم ڕادەپـەڕم بـە گـورجـی بـە پـەلە پـەل
تـێدەکـۆشم بـێوچان بـۆ ڕزگـاری دیـن و گـەل
سا مـوسلیمین مـوژدەبێ کـاروانـمان گـەیشتە کـەل
عـەلەمدار مـوژدە ئـەدات عـەلەممان هـەڵکراوە
بە خوێنی سوری شەهید ناوی خـوای لێ نـوسراوە
قـانون ئـەساسی ئـیسلام تـێدا نـەقش کـراوە
حەرەس لەدەوری ئـەڵێی سـەوڵە هـەمو وەسـتاوە
هــەمو بــە گـیانو بـە دڵ پـارێزەری عـەلەمن
بـۆچاکـتر شـەکـانەوەی ئـەو عـەلەمە بـەخەمن
شـافیعیان مـوژدە بـێ کـاروانـمان بێ وێـنەیە
لە ڕۆژی کـارەزارا سـوپایەکـی ئـەعزەمن
ئـەم بـەڵێنەی مـن داومـە کـە گـیانم بـۆ ئـیسلامە
دیسـان نـوێی ئـەکـەمۆ ئـەو بـەڵێن و کـەلامە
ئـەڵێین ئـێمە فـیدایین لە ڕێگـەی ئـەم ئـیسلامە
بـێدین بـۆ واز نـاهێنی بێ شک عـومرت تـەمامە
بـەرگی زرێـم پـۆشاوە سـیدقو عـەبایە و مێزەر
بە ئیرس بۆم بەجێ مـاوە لە مـیراتـی پێغەمبەر ﷺ

با دوژمــن هــەر بنالێ وا باغەکـەم هـاتەبەر
تـا ئـەبەد بـەردەوامـە سایەی حـەزرەتی لەسـەر
مەدرەسەی بەرزی قورئان دەرسـی بڕوای پێداوم
پـیشەم خـەباتە بـۆ دیـن تـاکـو لە دونـیا ماوم
ئـــارەزوم بـەرزی دیـنە وەهــا تــەعلیم کـراوم
بێدین ساگۆڕت گومکە تازە لە خەو هەستاوم
هاوین ٦٨/٦/٥

## «سرود»

من کـە ڕۆڵـەی مـوسوڵمانم ڕانـاوەستم لە خـەبات
ئــامادەم بـە دڵ و بـەگـیان بـۆ تـێکۆشان و جـیهاد
بە نوری شەمعی قورئانی ڕوناک ئەکەم سەر بیسات
ســا مـوسوڵمانان ڕاپـەڕن لەشکـری قـورئانیهات
براکەی من ئەی موسوڵمان هەستە جیهاد بـەر پـایە
کـاتی هــەڵمەت تـەنیانابی پشـتیوانت خـودایـە
ئـێمە ڕۆڵـەی ئـیبراهـم و نـەوەی سـەلاحەددینین
بـــەوشەی (الله‌اکـــبر) دوژمــــنان دەڕوخـــێنین
دەرســـی بـڕوامـان لە مـەکـتەبی خـودادا خـۆندوە
مــودەڕیسمان مــوحەممەدە تــاکـو ئـەبەد زیـندوە
خـوێنی عــومەر پـاڵەوانـی مـەیدانـی مـەردایـەتی
بـــۆ تـێکۆشانی مــوسوڵمانان وا ئــەدا شــایەتی
(واعـتـصموا بـحبل الله)یـە کـەلامی خـوایــەتی
سـەنگەرت چاوە ڕوانـە بـۆ برایـی و مـەردایـەتی
ئەی برای موسوڵمانی من تاکو کەی ژێر دەستەبین
تاکو کـەی کـۆتو زەنـجیرو ئـەسیرو پێبەستە بـین

سەنگەری ئیسلام بە تەمای هێزی دەستی تۆیە دەی
تۆی ئەبێ حەمزە و عومەر لەم ڕۆژەدا بیرۆ بخەی
ئەبێ فەرمانی قورئانی بە گوێی ناحەزدا بدەی
دەسا بێدین ئێمە هاتین بۆ کوێ گیانت دەرنەبەی
پیشە و نیشمان تێکۆشانە قەد لە جیهاد ناسرەوین
موسوڵمانین بە وزاوەی دوژمنی دین ناخلەتین
۶۹/۶/۴

## «سرود»

مـــن مـــوسوڵمانم گـیانم فـیدایـە فـیدای ڕێـبازی «رسـول‌اللە»یـە
شوێن‌کەوتوی حەزرەت ئال و یارانم پـێشرەوی کـاروان مـوسوڵمانانم
ئـێمەش بـەوێنەی حـەزرەت و یاران دەکـەین جـیهادی کـوفرو نـەیاران
ئـاڵای ڕەنگـین و خـوێنینی قورئان هـەڵدەکـەینەوە وەک جـاری جاران
دڵـــی ســـتەمکار دێـنینە لەرزە خـوا فـێری کـردین ئـەم بیرو دەرزە
فـەرمانی جـیهاد ئـەمری خـودایـە ئـەمرێکە حـوجەت هـەتا هـەتایە
ئــەو ئــەمرە لەلای «رسـول‌اللە»وە گـەلێک بـە چـاکـی بـە ڕێ بـراوە
هـەر چـوار خـەلیفەی بەڕێز ودڵسۆز نـەقشەی ئیجرایان دان بـە گەلوهۆز
حـەزرەتی عـومەر خـەلیفەی ئیسلام بە خوێن ڕەنگی کرد مەکتەبی ئیسلام
بـۆئەم دیـنە بـو حـەزرەتی عـوسمان گـیانی فـیدا کـرد بـە ئـەمری یـەزدان
حـەزرەتی عـەلی شـێری یـەزدانـی گـیانی بـۆ ئـیسلام کـرد بـە قوربانی
ئـەی دایک و بـابان مـنیش ئیسلامم ڕزگـــاری دیـــنە ئـــیش و پـەیامم
شـەرتە هـەتاکـو ئـەم گیانەم گیانە کـارم‌لە ڕێی دیـن هـەر تـێکۆشانە
دایـــە ئـەوا چـوم بـەئیزنی خـودا دەبـــمە گـــوڵاڵەی بـاغی شـوهەدا
بـەڵام ئـەو کـاتەی بـەرگی خوێنینم دەهـــێننەلات هـیچ نـەکـەی شـینم
بـڵێ سـەد شـوکر سـەربازی خوایـە ڕێـــبواری ڕێگـای «رسـول اللە»یـە
ئـیستە دەعـوەتی خـوانـی خـودایە (عـــند ربّـــهم یـــرزقون) وایــە
۶۹/۶/۱۸

## «سرود»

من شەهیدم بە خوێنم ئاڵای ئیسلام ڕەنگین ئەکەم
دوژمنانی حەق بمرن واهات لەشکری دینەکەم
لەبیرم ناچێ زەحمەتی پێغەمبەری ڕێبەرم
لە یادی ناکەم خوێنی عومەر جێگەنشینەکەم
لە ڕێی دینا ناسرەوم شانازیە شەهید بونم
با خوێن تێکەڵ کەم لەگەڵ عوسمانی (ذی‌النور)ینەکەم
ئاڵای پیرۆزی ئیسلام تاکو ئەبەد نانێمە ئەرز
سەردەکەوم یادەمرم لە خەباتا بۆ دینەکەم
بە هەڵمەتی حەیدەری قەڵای دوژمن دەڕوخێنم
خوێنی گەشم هەوێنە بۆ سەرکەوتنی دینەکەم
سەربازی پێغەمبەرم جیهادە پیشە و ئیشی من
ڕێگەکەی ئەو بەرنادەم ئەمرم بۆ بەرزی دینەکەم
من شەهیدم بە خوێنم گوڵانی ئیسلام ئاو ئەدەم
تا لە بەین ئەبەم هەمو بزاری دەوری دینەکەم
بەڵگەی سەربەرزی‌یە پێم کاتێ ئەچم بۆلای خودا
پەیمانی پێغەمبەر و کفنە بە خوێن ڕەنگینەکەم
من شەهیدم ئەی کاروانی موسوڵمانان وەسێتە
بپارێزن سەنگەری بەخوێنی ئاڵ ڕەنگینەکەم
من شەهیدم خوێنەکەم تاکو ئەبەد نابڕێتەوە
ئیفتیخارە بۆ خۆم و بۆ ڕێبەرانی دینەکەم
من شەهیدم بە مەرگم ژیانێکی سەرمەدیم هەس
هەدیە بۆ پێغەمبەرم جل وبەرگە خوێنینەکەم
من شەهیدم ئەوا چوم فەرزە لەسەر هەمو ئێوە
پارێزگاری لە قورئان و سەنگەرانی دینەکەم

۶۹/۶/۲۷

## «سرود»

مانگی (ربیع‌الاول) مـانگی جـه‌ژنو شـادی‌یه

له دایک بـونی ڕه‌هـبه‌ر بـه‌رهه‌می ئـازادی‌یـه

یادی ئه‌و ڕۆژه به خێر هیوای چینی مه‌زڵومه

(واعـتصموابـحبل) ئـاکـامه‌کـه‌ی مـه‌علومه

خێرو بێری ئه‌و ڕۆژه له بۆ گشتی و عمومه

به خێرهاتیه‌وه ڕه‌بیع خێرت ئازای داگرتین

یادی حه‌ماسه‌کانت ده‌رد و داوی لابـردین

ڕۆژی مێژوی که‌سێکی ئازادی بۆ هاوردین

ڕۆژی له دایک بونت هه‌موده‌ستی یه‌ک ئه‌گرین

بـه‌ڵێن تـازه ئـه‌کـه‌ینۆ ڕێبازه‌کـه‌ی تـۆ بگـرین

جیهاد بۆ به‌رزی ئیسلام یا له‌پێناویا بمرین

هـه‌مو فـیدای ئـیسلامین بـونو مـانمان بـۆ دینه

پشته سوری وه‌عده‌ی خواین پشت نابه‌سین به‌م ژینه

موجاهیدی ڕێی دینین ئیمانمان زۆر به تینه

ئالآی پیرۆزی ئیسلام به دڵ ئـه‌گـرم ئـه‌ینێژم

هه‌رلا دوژمنی لێ بێت به‌ده‌نگێکی به‌رز ئێژم

له بۆ به‌رزی ئالآی دین حازرم خوێن ئه‌ڕێژم

ئه‌م دینه بو وا حه‌مزه‌و سه‌دان که‌س له پێناوی

ئه‌بینران قوربانی بون له مـه‌یدان بـه خـوێناوی

ئه‌وان وا ئه‌یانپاراست که ئێستاش ماوه ناوی

ئه‌وان چون به‌ره‌و خودا به ڕوسوری و سه‌ربه‌رزی

له مـێژو تـۆمار کـرا ئـیستیعمار بـه‌وان له‌رزی

ئه‌مانه‌تیان جێ هێشت و خۆیان چون به سه‌ربه‌رزی

۶۸/۷/۶

## «فارسی»

کبکیم بی یار و یاور عاجزم اندر قفس

دوری از یار است زجرم میدهد در هر نفس

کی رهایی یابم اندر این همه بند و فغان

تابه کی یارب رود من عمر و دلدارم عبس

ناله و زاری کنم گر روز و شب نگریسته‌ام

هیچ ندارم خیر و احسان من زپیش وهم زپس

گر نباشد شاه لولاک روز رستاخیز شفیع

منزل و مأوی جهنم مار و عقرب یار وکس

ای شفیع مذنبان دستم بدامانت دخیل

شاهدی، شهدی، مرانم آمدم همچون مگس

بال و پرسوخته به محضر آمدم با اثم و غم

غم چه دارم گربه محضر میرسم صدبار نجس

یارسول الله ﷺ ندارم طاعت و از جود تو

کی شود محروم هزاران جانی و پست ونجس

عاجزم درمانده‌ام ای رحمةللعالمین

مستمندم روز محشر تو به فریادم برس

گر نباشی دستگیرم وابمانم در عرق

عالمی گردد خبر دار با صدایم چون جرس

عمر خود را صرف کردم در پی جمع گناه

پشت زیر بار عصیان میبرم همچون فرس

زیر تیغ ناب نفسم او ندارد هیچ دریغ

آمدم تا قلب عاصی باشدش لطفت حرس

از پی لطفت بگردم ماه و مهر و هم زمین

کی شوی نژماری محروم تو ز لطفش چونه بس

۷۶/۳/۳

## در وصف تو

ذات حق در وصف تو بود احسن تقویم گفت
جمله مخلوقات ز بهر وصل تو زاعیل کوفت

آسمان روی تو بود بهر رجم عاندین
زینت آرا باغ انجم جمله گشت از فرد و جفت

چشم اختر سای تو است مثل جام سکندر
صد هزاران رمز واسرار باشداندر آن نهفت

تیغ ابرویت چگویم همچو تیغ شیر حق
مثل من بس قیسها از درد آن در خاک خفت

ای که رنگ چشم زیبایت همی گویم بدل
سرمهٔ طور و تمام سرمه‌ها را کرده افت

همچو لیلا مهر تو در قلب این مجنون بس
هر چه بیشتر هم بگویند لانمان راحرف مفت

یک قدح بردار و گامی بهر حق نه بر دلم
پیش از آنکه بانک آید عاشقت در گور خفت

با دلی مملو ز حب رو کن نظر بر شعر من
گو که نژماری بعشق من چنین نظمی بگفت

۷۷/۵/۱۴

## «بنما ترحمی بمن»

گر بگویم کلب توام که داند مقبول تو ام
تو خود دانی که مجنون ومریض ومعلول توام

بنما ترحمی بمن اظهار کن لطفی بمن
تو خود دانی که عاشقی در بند و مغلول توام

شادم بمیرم در فراق ز بهر عشق و اشتیاق

تو خود دانی چراغ دین شهید ومقتول توام

خوشا که جانم در رود به پیش آن سلطان رود

تو خود دانی کنم شادی از آنکه مقتول توام

جانم کنم فدای تو فدای خاکپای تو

تو خود دانی کنم سرور که کلب مجهول توام

یارب شود نصیب من زیارت آن حبیب من

بردار نقاب زروی خود جانا که مشغول توام

## «یاد تواست حیات من»

یاد تو است حیات من قهر تو است ممات من

لطفی بفرما جان من عطا بکن برات من

در وصف تو لال است زبان گنگند هزار قس و حسان

ای حاتم باب احسان عطا بکن برات من

در نعت شاهی مثل تو حیرانی مثل من حزین

روانباشد دم زند که رفته است نشاط من

به دور رخسار مهت قریب زکوی و هم رهت

پروانه وار بسی جم‌اند چون دل بی بساط من

نزماری چون قیس حزین شد ناخدای درد وشین

همواره گوید بر درت عطا بکن برات من

## «از ابتدا کلام من»

از ابـــتدا کـلام مـن بـرای لایـنام مـن
ثـنا و شکـر بـی‌کران بـعداً بـود سـلام مـن

بـروح پـاک رهـبرم مـحبوب ذات اکـبرم
رسول و هـم پیامبرم شـاه بـلند مـقام مـن

صلواتی بهر او لایق ز سـوی ذوی خـلایق
شام و سحر باد دم بدم همراه با سـلام مـن

بـا سـلام اهـل وفـا درودِ اهـل اصـطفیٰ
نثار ذات مصطفیٰ ﷺ ذات بـلند مـقام مـن

بر آل و صحب و تابعین بر اولیا و عـارفین
بر جمع کـلّ مسـلمین تـحیّت وسـلام مـن

۷۸/۴/۲۳

## «آموزگار»

آمـــوزگار ای یـار مـن    یـــاور و غـمخوار مـن
سـلام مـن بـر تـو بـاد    هـــمیشه بـاشی دلشـاد
هـــرگز نـباشی مـریض    نـــزد مـا هسـتی عـزیز
تـــو مـعلم مـائی    دلســوز مـا شـمائی
مســـتحق سـلامی    تـــو انســانی تـمامی
ادب و درس و شـــعور    بـه ما میدی بی قـصور
بـه مـا ارکـانهای دیـن    بـالحنی خـوب وشـیرین
بـــا عـــمل و بـاگـفتار    مـــی‌آموزی آمـــوزگار
هـــمیشه دوسـتت دارم    امـــرت بـــجا مـــی‌آرم
تـــوخیلی مـــهربانی    در فکـــر شـاگـردانـی
مـن بـا دیـدارت شـادم    تـــو نـــمیری از یـادم

نـامت نـقش دل مـاست جـاودان و پـا بـر جـاست

مــــن زادهٔ نــــژمارم از نــــادانــــان بــــیزارم

مـــمنون زحـــمتهایت خـــدا مـــیده جـزایت

به درخواست پسرش عبدالرحمنْ در روز معلّم جهت تقدیر از آموزگاران نوشته شده

۷۷/۸/۲۱

## «رباعیات»

هــەوری زوڵـفت لاده بـەڵکو مـاهی تـابان دەرکـەوێ

چاوی هیوام بەش به شەمس و ڕۆژ و چەن ئەختەر کەوێ

ئـاسمانی ڕوت عـەجایەب تـۆله مـن پـەنهان ئـەکـەی

بـــێڵە بـا چـاوم بـە دورری بـێکەسی بـەندەر کـەوێ

۷۶/۲/۲۱

(۱)

زۆر کەس هەن دایم داعی ویساڵت موشتاقی مـانگی ڕوخ و جـەماڵت

منیش یـەکـێکم لەو مـەجنونانەی بـونەته عـاشق شـێوەی کـەماڵت

(۲)

ڕشتەی حوببی تۆ نەڵێم بچڕێنم له چـەندین لاوه چـم بـیقرتێنم

هەتا چەن گرێی تێکەوێ بەڵکو یەکجار نـزیکیت بـەدەس بـهێنم

(۳)

بمژگانم خاک پـایت کـهم جارو همی مالم گـرد نـعلینت بـه ابـرو

بدنبال مهر تو گردم من چو قیس به هر ثانیه نه صدبلکه هـزار سـو.

(۴)

ازآن ترسم در این گردش ز هـجران بــــرنجانم دل خــــویشان ویــاران

که مـهر مـن چـو ابـر سـایه افکـند ولی تـــو نــــیزه‌ام زدی هــــزاران

۶۸/۱۱/۸

عهد باشد ای خدایا مهر باشد میم من
جور دور از جَور باشد حرف دوم جیم من

یای من را یار باشد تا ابد گر زنده‌ام
دال من دور از دروغ است تابسر من زنده‌ام

******

دلا برخیز و دلدارت به آغوش محبت گیر
به پیر میکده ملحق بیاد حق تو آرام گیر

بجو از باده نوشان خرابات نوع مَی‌ها را
بدو دست و بدندانت بتعجیل رو تو جامی گیر

******

زنخجیران زلف تو رسن ریسم بخودکارم
بعنق و پا بیاویزم بیالایم بدلدارم

سَرو کَی لایقت دارد بسانِ تو روان باشد
به آهوی خُتن گوئید ذهاب جوید زدلدارم

******

ئەو کاتەی ئەمرم دەرئەچێ گیانم    خۆزگایە بەلەیل ئەکەوت چاوانم
ئەوەکو لەوێ ئیتر ئەی‌بینم    چون ئەو پاکە و من پڕ لە تاوانم

******

گەر ئەم دونیایەم پێ بدرێ یەکسەر    یاخۆلە دونیا ببم دەربەدەر
ئەبون،ئە، ئەبون وهام لێ ناکات    مەیلی تۆم ئازیز لە دڵ چێتەدەر

۷۷/۵/۲۴

*********

ئەگەر عالم ئەبێ عالەم ئەبێ وێڵ    هەمو حەیران بە وێنەی مەرکەبی خێڵ
بە هەر لادا ئەچن تا ئەچنە سەر داو    وەکو ماسی بەهارو ڕوباری لێڵ

*********

ئاورم بەردا لە خەرمانم    سوتانم گشت دەخڵ و دانم
ئەوا هاتم جوابم مەکە    واجبی ڕەحم و ئێحسانم

*********

کێ بێ بتوانێ مەدحی تۆ تەواو    واکە پێویستە بهێنێتە ناو
هەرکەس هەرچی وت قوسوری تیاکرد    تۆ کەخوا بۆ خۆی کردیتیە هاوناو

*********

## وەرگێراوی فارسی

بە دەس چاوو دڵۆ هەی داد و بێداد    کە هەر چی چاو ئەبینێ دڵ ئەکا یاد
دروس کەم خنجێرێ نوکی لە پۆڵا    بدم من پی لە چاو، تا دڵ بێ‌ئازاد

*********

در گناه و بی‌ساحلم    کشاورزی بی‌حاصلم
ملفوفِ دام و کید نفس    از محصول خود غافلم

*********

خوشا با یار خود دلداری کردن    بباشد از سوی وی غمخواری کردن
رئوف و هم رحیم باشد عزیزت    حذر داری تو از بیعاری کردن

******

جمال یار خود را رؤیت نمایی    ز بهر عشق یار باشی فدایی
تو هر مویت اگر باش زبانی    هزاران بار کنی تکرار ثنایی

******

عالمین را می بیارزد نقطه‌ای زان تار زلف
تار زلف دست خورده با یدین بادو طلف
گر بمیرم در فراقت مرغم دوری خورم
چون بپیوندم به عشّاق در مساف سلف و خلف

******

دوک ریسی مثل شیرین وفائی کی بود
قابل تحسین و مدح و سجع و شعر یکنواخت
دختری چون اردلانی را بباید تو ستای
آنکه در میدان نالی اسب همت را بتاخت

******

دلت باشد به یاد یار دلدار — منوّرتر ز نور و شعلهٔ نار
بذکر یار غافر شود آرام — دل بدتر ز گرگ و هم سگ هار

******

بیاد تو دلم دارد میل گل — ز تو خیزد عزیزم بوی هر گل
بقربانت شود نژماری صد بار — که از بهرت شده دیوانه بلبل

******

بیا ای جان من قربان جانت — بروح وجان شوم من پاسبانت
تو که دایم امینی در امانی — پذیراباش دلم مثل امانت

۷۶/۳/۴

******

بدست خود بکندم من چه چاهی — مگر من را برآرد لطف شاهی
بیفتادم بدام نفس و شیطان — خلاص من بدست اولو جاهی
اگر لطفش نباشد یار و یاور — بچاهایم در دو عالم نه چاهی
پناه آورده‌ام پیر خرابات — یقین دارم که خیلی را پناهی
بجاه حضرت ختم النبیین — بگیر دستم در این بحر تباهی
در این حالی که من در بحر عصیان — چنین غرقم برم‌آر از مناهی

۷۹/۶/۲۷

## «لە سەر بەرگی قورئانی منداڵێک نوسیویەتی»

هەر کەس لەم دونیا تۆی کرد بە مایە    عومری ئازیزی نەچو بە زایە
ئەو کەسەی پشتی کردە تۆ قورئان    پەس‌تر لە وەحشی، لە کەروگایە
داوام ئەوەیە لە وردو پیران    خۆیان بۆ ئاخر نەکەن بێ‌مایە
بە پێی دەستوری قورئان جوڵێنۆ    هەتا وەک مەردان بگەن بە پایە
تا ڕۆژی گەرمای حەشرو قیامەت    لوتفی حەق بۆیان ببێ بە سایە
تکاش کەن بۆ من لای تکاکاران    بەش تکام بۆ کەن لای ئەو خودایە
هەرچی هەم ئوممەت دۆستەکەی ئەوم    با خۆیشم نەمێنێ مایە و سەرمایە
دیارە کە عەبدێ سەرکەش و یاغیم    دڵخۆشیم تکای (رسول الله)یە

نژماری موخلیس ئەو کەسانەیە
هەرکە قورئانیان لا بەرنامەیە

******

ئەر کەرێ بێنی بیکەی بە سەردار    لە حەریر بۆی کەی کۆپان و هەوسار
تەڵای سور بێنی بۆی بکەی بە ناڵ    برنج و گۆشتی پێدەی لە جێی تاڵ
لاناچێت لە سەر هەیەتی کەری    گەر بڕوای پێ‌کەی ئەو تۆو تۆ کەری

********

سەرای‌سینەی لەیل سەرای سینەی لەیل    لەیلی حاتەم سا کەرەمدار پڕ مەیل
مەر یاوۆ وەداد دڵەی پڕ ئێشم    ماسازدا وە لوتف دەرونی ڕێشم
ئەنا من کفتی کەفتەی کۆی تاوان    کەی ڕوم هەن ئازیز گێلۆوە باوان

********

کەتۆ ڕەحمەتەن (للعالمین)ی    منیش هەر یەکێ لە عالەمینم
ئوممەتی موجریم بارەگای خۆتم    تۆش فەرموت شەفێع بۆ موزنیبینم
دڵخۆشم سەدجار گوناهباریش بم    چونکە ئوممەتی شای مورسەلینم

********

خداوندا بدل دارم تمنّا    بجاه شمع دین آن پیر والا
بحق آل او و هم صحابین    بحبّ جمع یاران و تابعین
گذر کن از قصور بیکرانم    زباب لطف‌وجود خود مرانم

